# نیشتمانێک لە شووشە

نیگار نادر



کتێب: نیشتمانێک لە شووشە – شیعر
نووسینی: نیگار نادر
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە:
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: جەلال ئەلیاس
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٦
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٧٢)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

من پایتەختی ئەو پیاوە
داگیرکراوانە بووم
لەسەر داگیرکردنم دەجەنگێن
نا من ئاڵای ئەو پیاوە
بێ ئاڵایانە بووم
لەسەر هەڵدان و... لەسەر داگرتنم
شەهید دەبوون

زۆرجاران کولکی بزن و مامز و
ڕێوی و دێڵ و گورگەکانم
لە خۆم هەڵدەقەند
نینۆکەکانم دەبڕین و



ڕەنگی سوورم تێ هەڵدەسوو
دەمێ وابوو گوێچکە درێژەکانم دەبڕینەوە
قۆچەکانم هەڵدەقەند و
مووەکانم ڕێک شە دەکردن
گوڵی بریقەدارم تێهەڵدەچەقاند
بەنێو مەجلیسی خاتوون و ئاغاژن و
ژنە ماقوڵەکان دەکەوتم
لە پڕ کلک و گوێچکەم لەبنڕا هەڵدەقەند
پۆشتەترین بەرگم دەپۆشی

***

لە پڕ لە زرینگە زرینگی خۆم
ڕادەچڵەکیم
دەمدیت پەرداخێکی
کریستاڵی بریسکەدارم
لە نێو پەنجەکانی بازرگاناندا
پڕ پڕم لە شەراب
لەسەر لێوی سیاسییەکاندا
پڕ پڕم لە خوێن

***

چ ڕەنگ هەیە لە خۆم هەڵدەسوو
جغارەیەکم دادەگیرساند و
دونیام دەکێشا
لە پڕ گەرم گەرم
لە چاوی ژنێک دا دەخزیم






بەسەر ڕوومەتەکانیدا
بەنێو دەزوولە دەزوولەی
هەناویدا ڕێم دەکرد
گەلێک دەمان
هێندیان گوڵ تێدا چاندبووم
وڵاتم بەسەر گوڵان دەگێڕا
کەس نەبوو لە گوڵەکانی منی بەسەرەوە نەبێ
لە گوڵەکانی منی لە یەخە نەدابێ

بەیانیان زوو زوو دەپشکوتم
هەموو ژنانی دونیا دەگەڵم دەپشکوتن
لە سەرتاسەری وڵات دەپشکوتین
کە کپ دەبووم هەموو پەیکەرەکانی
خۆمم دەشکاندن
پەیکەرە برۆنزەکان، پەیکەرە بەردەکان،
پەیکەرە شووشەکان
لەت و پەتکەکانیانم تێکەڵ دەکردن
یا هەموو نیگارەکانی خۆمم دەدڕاندن
ڕەنگم بەسەر هەمواندا دەپژاند
ڕەنگەکانم لەسەر یەکدی تێکەڵ دەکردن تا
جێ چرنووک و برین و قەپەکانی لموزم
داپۆشم

***

ئێواران پڕ پڕ دەبووم

له کۆتر و تێیاندا دەگماندم
کوند لەسەر پێیەکانم هەڵدەنیشتن
قاز و قولەنگ له زۆنگاوەکانمدا مەلەیان دەکرد و
خۆیان له ئاوەکانم هەڵدەکێشا
زۆر جاران پەیکەرێکی ڕووتیان لێ دادەتاشیم
لەسەر مێزی گەورەترین بڕیار
دایان دەنام
یا دەسک دەسک دەیانچنیم
لەسەر مەزاری شەهیدێکیان ڕۆدەنام
چرایەکانم یەکە یەکە خەفە دەکردن و
سەرخەوێکم دەشکاند
کە وەخۆ دەهاتمەوە
گەورەیان دەکردم
جۆرەها کەراسی شۆڕەوەبووە و
بەرموری درێژ – درێژ و
بەرگی قەبە و ئەستووریان له بەر دەکردم
چی دەسماڵی پۆپەشمینە و
پووڵەکە دۆزیان هەبوو
تێیان وەردەگرتم
هەر خۆم وەبەر شەوقی تۆ دەکرد و
منداڵیەتیم چۆڕ چۆڕ لێ هەڵدەڕژا

***

نا... من ئەو پایتەختە وێرانەی
هەر پیاوە و ئاڵایەکی لەسەر هەڵدابووم



له شەکانەوەشمدا
نینۆک بەنینۆکی دەرهێنابووم
هەزاران جار چی پشیله و سەگ و
بەراز و ورچ و وڵاخ هەیە
بەسەرم پەڕیبوون
له ئیسلام و له گاور و له مەسیح منداڵم ببوون
له سەرکردە و له شێخ و ئاغا و
له سەرۆکی هەموو عەشیرەتێک منداڵێکم هەبوو
چێ کوڕ و کوڕێژگەی جحێڵ هەبوون
گوڵیان له پرچەکانم دابوو
پەنجەکانیان ڕاگوشیبووم
لەسەر سینگم نووستبوون
هەزارەها تابلۆیان بۆ کێشابووم
جۆرەها ڕەنگیان تێهەڵسووبووم
ڕەنگی ژیان... ڕەنگی هەتاو
ڕەنگی مردن... ڕەنگی دەریا
ڕەنگی فریشتە... ڕەنگی سۆزانی
زۆر له نیگارکێشەکانی وڵات بازرگانییان پێ دەکردم
له پیشانگەی هەرە گەورەکانیاندا نمایشیان دەکردم
لەکن زۆری دەدیان له ژوورێکدا
دەکەوتم کۆڵێک خۆڵم لەسەر دەنیشت
زۆر له ڕۆماننووسەکان
لەنێو گەلێک نووسینەکانیاندا
لاپەڕەکانیان پێ نووسیبوومەوە

له ئینجیل و قورئانەکاندا لەسەر
ڕەفەیەکی بڵند دانرابووم
له هەموو مۆزەخانەکانێ وڵات پەیکەرم هەبوون
تابۆیەکی خەست خەستیان لێ وەبەرهەم دەهێنام
زۆر بریقەدار شیعاری گەورەترین
حزبیان پێ دەنووسیم
له لافیتەی هەموو مردووەکانیان هەڵدەسووم
سوور سوور له دیوارەکانی
ئەوینیان دەخشاندم
ڕەش ڕەش له
له پێڵاوی هەر پیاوێک و هەر گەورەیەک و
له پۆستاڵی هەر سەرکردە و سەرۆکێکیان دەخشاندم
بەڕیز ڕاوچی قولابیان له
دەریایەکانم دەهاوێشت
جۆرەها مەلەوان خۆیان له
کەنارەکانم فێر دەکرد
هەموو مەلەوانەکان بۆ مرواری و زمرود
بەبنی ئۆقیانووسەکانمدا هاتوچۆیان دەکرد
***
شەوان ڕەش دادەگەڕام
بەملیۆنەها ئەستێرەم لێ وەدەردەکەوتن
سبەینان بەرۆکم دادەچەقاو



خۆرم لێ بەدەر دەکەوت
هەموو هەورەکانیشم بەخۆوە دەگرتن
***
له چوارچێوەیان دەگرتم
له چوارچێوەی دار
له چوارچێوەی زێڕ
یا بەدایک... یا بەمنداڵ...
یا به مردوو یا به شەهید
بەدیواریان دا دەکردم
یا بەسەرکردە... یا بەخۆشەویست
هەڵیاندەواسیم...
***
لەپڕ لەنێو ڕۆحی
دارهەنارەکان وەشنە شن دەکەوتم
مووەکانم شە دەکردن
وەک گوڵدانە گەورە و
ڕەونەقدارەکان له دیوەخانی ماڵێک...
له دیوانەکانی سیاسەت...
له سەر مێزەکان
له شووشە بەندەکان ڕایاندەگرتم
یا وەکو شەڕاب له شوشەی مل باریکدا
له بوتڵی ڕەنگاوڕەنگدا
قازاخ قازاخ
ڕایاندەوەشاندم

یا لە قەسابخانەکانی شاردا
دەگەڵ کەلاکی مەڕێک... گوێرەکەیەک
گیسکێک، کاوڕێک
بەیەک شیشەیان دادەکردم
بەحەپەساوی ڕام دەکرد
غارم دەدا بەسەر پەرژینەکانی ژنیەتی دەکەوتم
بەنێو لیتەکانی ژنبوون دەکەوتم

***

لە هەموو مۆزەخانەکانی وڵات
پەیکەرم هەبوون
هەندێک پەیکەرتاش فریشتەیەکیان لێ داتاشیبووم
لە هەندێکی دی ڕاهیبەیەک
لە هەندێکی دی سۆزانییەک
لە هەندێکی دی سەماکەر
لە هەندێکی دی بێری و
گۆزەکانی دونیایان لەسەر شانم دانابوو
زۆرجاری دی لە زیندانێکی تاکە کەسیدا
هەموو عومرم گوزەراندبوو
زۆر جاری دی لە زیندانی گشتیدا
یاخو خۆم ببوومە زیندان و
سەدان زیندانیم تێدا پەروەردە ببوو

لە پڕ بەشەو دادەگەرام
شەوم لێ دەپرینگایەوە



شێرەکانی سیاسەت و شێرزادەکانی ئەدەب و هونەرم
دە شەوەکانم دا ون دەکردن
باوەشی خۆم بۆ والاّ دەکردن
شەویان دەکردە دەمامک و زیندە بەچاڵیان دەکردم
قەسابەکان پێستەکەیان خۆش دەکردم و
قامچییان لێ دروست دەکردم
دەیاندامە دەست دەسەڵاتدار و پیاوماقووڵ و
خانەدان و جەللادەکان
پڕ پڕ بووم لە کارخانە
بە هەزاران ژن کاریان تێدا دەکردم
هەزاران بەرهەمم لێ وەبەر دەهات
لە کارخانەیەکم شووشەیان
لێ دروست دەکردم
لە کارخانەیەکی دیدا ئاڵتون و خشڵی هەمەجۆر
لەکارخانەیەکی تردا تەختە و دار و
لە کارخانەیەکم کتێب و
لە کارخانەیەکم مۆم...

***

کێهە ئەندازیاری
شارەزایە گازیان دەکرد
پتەوترین باڵەخانەی
سیاسەتیان لەسەر ڕۆدەنام...
گەورەترین هۆڵی هونەرییان لەسەر ڕۆ دەنام
ژێریان دەکردمەوە ژێرخانی ئابووری






تەلبەندیان دەکردم
منداڵەکانی هەموو دونیایان تێدەکردم
باخچەی گەورە و بەرین...
قەفەزی گەورە و گچکە
جۆرەها ئاژەڵیان تێدا بەند دەکردم...
ناڵبەندی کارزانیان لە چەند وڵاتان ڕا
دەهێنا ناڵیان دەکردم
بە زێڕ بە زیو بە ئاسن
بە نەخشی جوان ناڵیان دەکردم
کارامەترین ئاسنگەریان دەهێنا
بە سەدان دەرگا و پەنجەرەی
پڕ شیشیان بۆ دروست دەکردم
لە پڕ قاقام دەکێشا
بەنێو هەموو کاتژمێرەکانی تەمەن دەکەوتم
تۆم دەکێشا...

***

بە تۆپ قوماشیان دەهێنا و تێیان وەردەگرتم
بە ئاوی هەموو چۆمەکان دەیانشووشتم
بە نێو مزگەوت و تەکیە و
بەنێو بەهەشتەکانی خۆیاندا دەیانبردم
ناسنامەی پاکیزەییبیان دەدامێ و
دەستیان زیارەت دەکردم
یا بەمقەست دەیانبڕیم... یا بەدەست
لەت و پەتیان دەکردم

جۆرەها چەفیە و لەچک و
ڕووسەرییان لێ دروست دەکردم
پرچی هەموو کەنیشکە و حورمەکانی
وڵاتیان پێدادەپۆشیم
یا لە گەورەترین مەڕاسیمدا
میدالیای کەڕامەتیان
بەیەخەوە دەخستم
تاجی شەڕەفیان لەسەر دەکردم
***
گەنمی... گەنمی دەچوومەوە و
لەسەرتاپام کێڵگەیان
لێ دروست دەکردم
هەموو ڕووەکێکیان تێدا دەچاندم
لەسەر سینگم گەنم و
لەسەر دەستەکانم تووتن
لەسەر قاچەکانیشم جۆ
لە تورەگەی ئەسکەناس و
ڕووپیە و... فلسەکاندا
خرینگەم دەهات
تا دەگەڵ دینار و دۆلار
لەسەریەکیان ڕیز دەکردم
***
لە پڕ دەگەڵ تیرەیەک
لە تیرەکانی تفتیلک دەکەوتم و



دەفڕیم و دەفڕیم...
هەموو شتێکم دەفڕاند
پرچەکانم بەسەر ئەنیەمدا
شۆڕ دەکردنەوە
تا جێ چڕنووک و جێ کەڵبە و
جێ نینۆکیان بشارمەوە

لە باخچەی ئاژەڵاندا
دەگەڵ سامناکترین
و دڕندەترین ئاژەڵیان دەکردم
پەیتا پەیتا منداڵ و جحێڵ و
پیری پەککەوتە خواردنیان بۆ دەهاوێشتم...
یا بەردیان لە دەم و چاوان دەگرتم
***
زۆر جاران تەخت وەردەکەوتم
هەموو باڵندەکانی دونیا
لەسەرم هەڵدەنیشتن
لەسەر دەست و ڕانەکانم
گەنمم بۆ ڕۆ دەکردن
لەسەر سەروو و چنار و دارگوێزەکان
هێلانەم بۆ چێ دەکردن
زۆر دەمان هەموو مۆسیقاژەنەکانی
دونیایان دەهێنا
لەسەر سینگم

کەمانچەیان دەژەنی
لەسەر پەنجەکانم پیانۆ و
لەسەر لێویشم
نۆتەکانیان ڕیز دەکردن

لەسەر گەورەترین مێزی وڵات
نەخشەکەیان ڕادەخستم
هەریەکەی بەقەڵەمێک بەڕەنگێک
خەتێکی لێم دەدا
جۆرەها سنووریان بۆ دیاری دەکردم
دەریا و چیا و دەشتیان لێ دادەبڕیم، لێ دادەکەندم

هەندێک جار بە دڕکەڵانێکیان دادەگەڕاندم...
زەرد زەردیان هەڵدایساندم
لە بن پێی شۆڕشگێڕێکیان هەڵدەچەقاندم
لەپی ژنێکیان شەقار شەقار...
پێ هەڵدەدڕاندم...

زۆر جار مەیمونێکی تەنها بووم
لە قەفسێکدا بۆ گەورەترین پایتەختیان دەبردم
شارە و شار دەیانگێڕام
لە سێرکێکدا... بەپارە خەڵکیان پێ پێدەکەناندنم...!

زۆر دەمانیش فلچەکانی ڕەنگیان



لێ وەکار دەخستم و
مووەکانیان هەڵدەقەندم و
برینەکانی ڕومەتیان ئارایشت دەدام و
بەناودارترین خانمیان... بەشەڕەفترین ژنیان
بەئاقلترین مەخلوقاتیان... دەناساندم

کە دەگریام زۆر دەگریام...
گۆی زەویان دەکردە زەنگوڵەیەک
لە ملیان دەکردم
مانگیان دەکردە تۆقەیەک و
پرچیان پێ قایم دەکردم...

ڕۆژی هەزار جار لە تەواوی وڵات
دەبوومە بووک و
جۆرەها تارایان لەسەر دەکردم
بۆ ئەو پیاوە بە جۆشانەیان دەبردم
هەزار جار دەمردم و... جۆرەها کفنی سپی
کفنی بەباق و بریقەیان لەبەر دەکردم
ئارام ئارام بۆ نێو ئەو خاکە
خامۆش بەردانەدا دەیانبردم...!

***

کە هەڵدەستام کۆشم پڕ دەبوون... لە نامەی ئەڤین و
گوڵی سوور و مەعشوقەکانیان ون دەکردم
لە نێوە ڕاستی ئەم شارە سێدارەیان بۆ هەڵدەخستم

مەقسەڵەیان بۆ گەردن ئامادە دەکردم

هار هار بە دووی ڕەوەیەک تانجی دەکەوتم
دەستیان بە یاڵەکانمدا دەهێنا و
ئارەقەیان دەسڕیمەوە
جوان جوان زینیان دەکردم
چ تفاقی سیاسەت و تفاقی ئەدەب و
تفاقی پیاو هەیە لێیان بار دەکردم

لە پڕ هەموو دەرگا و پەنجەرەکان دیوار و
شوورەکانم لەخۆ دەشکاندن و
لە خۆم هەڵدەهاتم

لەناکا و ئاڵایان لەسەر دەچەقاندم
ئاڵایان لەسەر بەرز دەکردمەوە
ئاڵای دین... ئاڵای غەز و... ئاڵای پیاوەتی
جار جارەش دەیانکردمە ئاڵا
ئاڵای شەرەف... ئاڵای ناموس
ئاڵای قەدەغەیەیی... ئاڵای سەرکەوتن
یا یەکە یەکە ئاڵایەکانیان دادەگرتم

کە تەخت وەردەکەوتم
هەموو گیانم پڕ دەبوو لەقەفەس
هەموو خوێنم پڕ دەبوو لەقەفەس



بە هەر موویەکی پرچمەوە
قەفەسێکیان هەڵدەواسی
کە دەریاییەکم لەبەر دەڕۆیشت
سزایان بەسەر دادەسپاندم
کە وشکم دەکرد.... هەر سزا
کە شیرم لەبەر دەڕۆی هەرسزا
کە شیرم وشکی دەکرد هەر سزا
کە دەیانفرۆشتم هەر سزا
کە دەیانکڕیم هەر سزا
کە وەدویان دەکەوتم هەر سزا
کە ڕەجمیان دەکردم هەر سزا
کە دەترەکیم هەر سزا
کە نەدەترەکیم هەر سزا
کە دیل بووم هەر سزا
کە ئازاد دەبووم هەر سزا
کە خۆشیان دەویستم هەر سزا
کە بەسەرم دەکەوتن، کە دەیان کردمە قامچی،
کە دەیان کردمە گوللە هەر سزا
کە بەناوم دەکەوتن هەر سزا

لەودیوی قەفەسەکان... لە ناو قەفەسەکان هەر سزا
کە دەژیام هەر سزا
کە دەمردم هەر سزا

تا دەبوومە مەزارێکی کپ لە سزا

***

کە قەدەغەبوونیان تێدا ڕادەگەیاندم...
قەدەغەیان دەکردم
نە کەس دەوێرا بە نێوم کەوی
نە بەنێو کەس دەکەوتم
گڵۆپەکانیان دەکوژاندمەوە
پەردەکانیان دادەدامەوە
دەرگاکانیان دادەخستم
سەدان تابلۆیان پێدا هەڵدەواسیم و
لەسەریان دەنووسی قەدەغەیە
دەیان بەیانیان پێدا دادەکوتام
لێیان دەنووسی "قەدەغەیە"
سەر شەقام و کەنارەکانیان
تەلبەند دەکردم
باخی گشتی و یاریگاکانیان
مین ڕێژ دەکردم
لێیان دەنووسی
بەناو کەوتنی مەترسییە
نزیک بوونی قەدەغەیە...
تەماشاکردنی قەدەغەیە

نەدەبوو کەس بە شەقام و
کوچەکانمدا هاتوچۆ بکا




Photo Faris Saadi

کەس لە دەریاکانم ڕامێنێ
کەس لە شۆڕەبییەکانم هەڵڕوانێ
نەدەبوو باڵندەکان تێمدا بفڕن
مەعشوقەکان دەستی یەکبگرن...
نەدەبوو بچووکترین دەرگام درزی تێخەن

***

لە پڕ هەموو شتێکم
لە قاوەکەی بەردەممدا تێکدەدا و
بە قومێک دونیام دەخواردەوە
پێم لە پشتی تۆ دەنا
سندمیان لە مەحکەمترین ئاسن
بۆ ساز دەدام
لە پێیەکانیان دەکردم....
لە ڕۆحیان دەکردم...
لە نێو ئەو هەموو قوفڵانەدا دانەدەکەوتم
پێم لە هەموو مەزهەب و سیاسەت و
عورف و یاساکان دەنا

***

زۆر دەمان هەر بە منداڵی
ڕوحیان ئاوە ڕووت دەکردم
لەسەر پشت ڕایاندەکشاندم
زوێڵێک گۆشتیان لێ دەکردمەوە
خۆڵەمێشیان پێ دادەکردم
فڕێیان دەدامە



بەر دەمی توتکەکان
گوێزان گوێزانی
کولیان پێ دەسویەوە و
داوێنی کەنیشکەکان
پێشەقاردەکردم
تا...
سەرتاپام ئەو کیژۆڵانە دایاندەگرت
کە گۆشتی خۆیان لە دەمی توتکەکان
دەردەهێنایەوە

***

لەپڕ ڕاویان دەکردم... ڕاویان پێ دەکردم
ڕاویان لەسەر دەکردم
ڕاویان لەنێودا دەکردم
هەموو گیانیان بە ساچمە و
گوللە دەتەنیم

زۆر دەمان دادەبەزین
دارستانەکانیان دەبڕیمەوە
نەمامەکانمیان ئاور دەدان
مووەکانیان دەکردمە جەلەب و
لە مەیدانەکان هەڕاجیان دەکردن

پرچەکانم لە شێوەی دوو کلک توند
دەبەستن و ڕام دەکرد... ڕام دەکرد

یەک یەک سێوەکانی ژێنیەتیم دەڕنین
پڕی کۆشم دەکردن

قەفەسەکانی نێو مێشکم
قەفەسەکانی نێو خوێنم...
قەفەسەکانی سەر پەنجەم
قەفەسەکانی چاوم
لێکڕا دەرکەکانیان دادەخستن
لە دەنگی ئەو دەرگایانە
ڕام دەبووم و دەکەوتم

***

زۆر ڕۆژان دەمم دەخستە دەمی پڵینگێک
دەمی بەرازێک
دەمیان دەخستمە دەمی چەقەڵێک
دەمی شێرێک و چاوەکانم دەنوقاندن

هەر کە دەنیشتمەوە
باڵەکانم ڕێک دەخشاندن نەرم نەرم دەڕۆیشتم...
لە پڕ پەڕ و باڵەکانی خۆم هەڵدەقەند و
ئەو دەنووکە تیژەم دەبڕییەوە
لێوەکانم سوور دەکردن، مۆر دەکردن،
شین دەکردن، شەڕابیی دەکردن، زەرد دەکردن

زۆر جاران گۆشتی سەگ و



گورگانیان پێ دەخواردم
یا وەک پارچە گۆشتێک
هەڵیان دەدامە بەر دەمی ڕەوەیەک سەگ...
دەیان لێسیمەوە و نەیان دەخواردم...
لموزیان لێ دەخشاندم نەیان دەخواردم
لیکیان بەسەر هەڵدەڕشتم و
نەیان دەخواردم
تێم دەنووسان... پێیان لێ دەنام
نەیان دەخواردم

***

کە ڕادەکشام دونیا دەگەڵم ڕادەکشا
کە دەگریام باران دەباری
کە پێدەکەنیم گوڵ دەپشکوتن

دەنا پیاوێکی لە تەختەیان
لەگەڵ جووت دەکردم
پیاوێکی لە بەفریان لەگەڵ جووت دەکردم
پیاوێکی لە شووشە، پیاوێکی لەبەرد
پیاوێکی لە ئاگریان
لەگەڵ جووت دەکردم
تا دەبوومە هەڵم و
خەست خەست دەباریم

زۆر جاران بە شەتڵ دەیانبردم...

شارە و شار وڵات و وڵات لە
ئینجانەی قەبە و جوانیان دەخستم
لە ئینجانەی بەردەمی ماڵە پاشایەک
یا هەیوانی ماڵە جوامێرێک
یا لە گوڵخانەی ماڵە سەروەرێکدا
لە شوشەیان دەخستم

باڵندانە دەڕۆیشتم...
باڵندانە دەفڕیم
باڵندانە پێدەکەنیم
باڵندانە بەنێو عەشق و ژیان دەکەوتم
باڵندانە پەڕەکانم لێک بڵاو دەکردن
باڵندانە نینۆکەکانم تیژ و
باڵندانە باڵ و کلکم لێ فش دەکردن

زۆر جار شیرم لێ هەڵدەچۆڕا
شیریان لەبەر دەگرتم
شیریان دەدامێ
لە گۆمێکی شیردا دەیان خنکاندم

زۆر جاران کەوەر دەکەوتم جاڵجاڵۆکە
جاویان بەسەردا ڕادەهێشتم و
داوێنیان دەتەنیم
کونی چاوانیان چڕ چڕ دەتەنیم



هار هار چرنووکم
لە هەموو ڕوومەتەکانی دونیادا دەدا
چ جانەوەرێکی خۆویست
چرنووکم بەخۆمدا دەهێنا
هەموو شتێکم لە خۆم دەڕنییەوە
جانەوەرانە ئاوێزانی ئاسکێک دەبووم
خۆم لەبەر باخەڵی وڵاغێک هەڵدەکرد
دەستم لە ملی گورگێک دەکرد
خۆم بە پشتی جوانوێک هەڵدەواسی

ئەوەندە دەنێو درەختەکاندا هاتووبووم
و چووبووم ڕەنگم درەختی بووبوو
ڕووم تاریک تاریک ئەو ڕەنگەی تێزابوو
ئەوەندە دەنووکم لە گوڵان وەشاندبوو
دەنووکم ڕەنگی گوڵانی تێزابوو

لخ لخیان موتوربە کردبووم لە دارهەنارێک
لە دار لیمۆێک، لە دار پرتەقاڵێک
لە دارگوێزێک
لە نێو درەختیی سێواندا
بە بەریان خستبووم

لەپڕ سەهەندێکی چڕ دایدەپۆشیم
نا دەبوومە سەهەند و






دونیام دادەپۆشی

یا باجیان
دەخستە سەر خانە خانەی لەشم
موو مووی پرچم و
دەیانکردمە بەباج
لەسەر خوێن لەسەر عەشق
لەسەر فڕین لەسەر شیر و
لەسەر ڕۆحەکانیانیان دادەنام

زۆر جار دەیانکردمە ئەسپێکی ڕەسەن
ژنێکی کحێل جوانویەکی ڕەسەن
نە ئاژەڵێکی تۆتکە نەدەر
جانەوەرێکی کێوی
ماینێکی سەر بێ ڕێشم
هێواش هێواش ڕامیان دەکردم
خرمە خرمێک لە
ڕۆحمەوە دەهات و
کەونم لە نێوخۆمدا
دادەڕووخاند

زۆرجار دەیانڕواندم
لە چۆلەوانییەک... لە ناوەڕاستی شار
لە شێتخانەیەک، لە هەتیوخانەیەک

گەڵای ناسکۆڵە و گەڵای خزیان پێ دەردەکردم
لە پڕ هەڵیاندەقەندم
یا دەیانبڕیمەوە سیسەمێک کورسییەکی
نەخشێنراوی تیاترۆیخانەیەکیان
لێ دروست دەکردم
سەرمەشقێکی زانایان دەهێنا و
مەشقی پێکەنین و مەشقی دەرکەوتن
و مەشقی ڕام بوون و مەشقی
سەرکردە بوونیان پێ دەکردم
یان چەفیەی ئاسمانیترین مەزهەبیان
لەسەر دەکردم
کراسی پاکترین شۆڕشیان
لەبەر دەکردم
سەوزترین شاڵی ئابڕوییان
بەسەر شانی دادەدام
هەموو تەسبیحەکانی قیامەتیان
لە دەستان دەکردم
بەسەر هەموو ئاوەکانی دونیادا
دەیانپەڕاندمەوە و
بە نێو هەموو دیوانە شەرعیەکاندا
دەیانبردم

قافڵە قافڵە لەشکریان دەهێنان
تا ڕامیان دەکردم



یا بەلەشکر ژن و
جانەوەری جەنگەڵەکانیان
تێدا ڕام دەکردم

لێوەکانم زەرد زەرد دەکردن و
بەنێو پایزی پیاوان دەکەوتم

***

زۆرجاران بە نێو باخەکانی عومرم دەکەوتم
لخ لخ دەیانبڕیم.... چڵ چڵ دەیانچنیم
باقە باقە دەیانڕنیم....
بۆ ژووانی لخ لخ دەیانبڕیم
بۆ نێو سەبەتەیەک
چڵ چڵ دەیانچنیم
بۆ باوەشی پیاوێک بە باقە
دەیانڕنیم...

وەکو قورئان دێڕ لەدوای
دێر دەیاننووسیمەوە
فەتحەوکەسرەی دونیایان
لەسەر هەر حەرفێکم ڕۆدەنان
جوانترین بەرگیان دەکردم
هەزارەها هەزار
سوێندیان پێ دەخواردم
لەبەرزترین ڕەفەی هەرماڵێک

هەر مزگەوتێکیان دادەنام
یەقینترین باوەڕیان پێ دەکردم

لە پڕ خۆمم شەق دەکرد و
هەموو شتێک شەق دەبوو
بە دوو وشە لە دارێک لە پیاوێک لە
بەردێک لە دڕندەیەک لە منداڵێک لە
میرێک لە دەعبایەکیان حەڵاڵ دەکردم
بە دوو وشەی دی لە مەعشوقێک لە
فڕندەیەک لە نیگایەک لە
خۆمیان حەرام دەکردم

زۆرجاران سوخرەیان پێ دەکردم
سوخرەی ماچ و سوخرەی زان و
سوخرەی پەرستن و سوخرەکێشیی
هەموو جوانەکانیان پێ دەکردم

***

چاوەکانیان دەخەساندم
لێوەکانیان دەخەساندم
پەنجەکانیان دەخەساندم
مێشکیان دەخەساندم
ڕۆحێکی خەساویان لە جەستەدا دەبزواندم
یا دەیانبەخشیمە
پیاوێکی خەسیاک



خەسیوترین ڕەنگی
تێهەڵدەسواندم
زۆرجاران تەواوی تەمەنم
لە حەرامسەرای ئیمامێک
لە حەرامسەرای پێغەمبەرێک
لە حەرام سەرای سوڵتانێکدا
بەسەر بردبوو
هەموو سەرایەکانم خامۆش و
حەرەمێکم نەشکابوو

***

گارۆیەکی قشتیلە بووم
دارێکم کون دەکرد
هێلانەم تێدا چێ دەکرد
چاوێکم کون دەکرد
هێلانەم تێدا دەکرد
ڕۆحێکم کون دەکرد
هێلانەم تێدا دەکرد
هەموو گیانیان دەکردمە هێلانە و
لەسەر هەموو درەختەکانی دونیا
هێلانەیەکم دەکرد

***

زۆرجار تۆڕێک بیرهەڵکەنیان
وەسەر دەخستم
قووڵترین بیریان لە مێشکمدا لێ دەدا و

نەدەگەیشتنە تنۆکێک عەقڵ
قووڵترین بیریان لە دڵمدا لێ دەدا و
نەدەگیشتنە تنۆکێک خۆشەویستی
قووڵترین بیریان لە چاوانم لێ دەدا
نەدەگەیشتنە قەترەیەک بینایی
قووڵترین بیریان لە جگەرمدا لێ دەدا
نەدەگەیشتنە دڵۆپێک منداڵییەتیم
قووڵترین بیریان لە سیەکانم لێ دەدا
نەدەگەیشتنە گەردێک لە هەناسەم
تا هەموو گیانم دەبوو بە بیر و
کەس نەدەگیشتە بنم
کەس نەدەوێرا بە ئاقارمدا تێپەڕێ

لە پڕ سپی سپی دەڕژامە
نێو دەمی هەموو منداڵێک
قەدی هەموو دەنکە گەنمێک
سینگی هەموو ژنێک
هەموو شتێکم دەفراژاند

شەکەت شەکەت هەموو گیانم خوێن و ئاو و
عەشقی لێ هەڵدەچۆڕا....

لە قوتووی ئاڵتونی هەر ژنێک
لە سەر سینگی هەر پیاوێک





لە نێو متوموری هەر کچۆڵەیەک
لە نێو چاوەکانی جحێڵێک
لە نێو هەر سورەتی قورئانێک
لە نێو جانتای هەر سیاسەتمەدارێک
لەنێو لەپی هەر شۆڕش فرۆشێک
لەنێو دامێنی هەر سۆزانییەک
لەسەر لەپی هەر جادوگەرێک
لە سەر نیگای هەر منداڵێک
لە نێو لینگی هەر بازرگانێک
لە نێو خۆڵی هەر چەرخێک
لە نێو ڕەگی هەر درەختێک
هێند لە خۆم گەڕابووم تا
"تاجە گوڵینەیەکم"
لەسەر خۆ دانابوو
بوومە مەزاری «ژنێکی ون»

دەنووکم لە دەنکە گەنمەکانی سەر لەپی
دەستت دەدا و تێر تێر دەبووم و
تێریم بە دونیا دەگێڕا

***

زۆرجاران لە تیرەی پڵنگێک
لە تیرەی ڕێوییەک خەزێکی جوان بووم
دەیانگرتم کەوڵیان دەکردم
کەوڵێکی بە نرخ بەسەر شانی



خانمێکیاندا شۆڕەوە دەکردم
بە پشت پشتی والیەکیان دادەدام و
لە بەر پێی شایەک ڕایاندەخستم

قەمچوور دەکەوتە سەر هەموو شتێکم
سەر بەسەریان دەگەڵ
هەموو شتێک پێ دەکردم
دەبوومە خوناوکەو
مەند مەند دادەوەستام و
تۆش تەماشای خۆت تێدا دەکردم

گوێچکەکانمیان دەسمین و
گوارەیان پێدا دەکردم
داوێنمیان دەسمین و
قوفڵەیان پێدا دەکردم
مەچەکەکانمیان دەسمین و
بازنەیان تێدەکردم

چی وشەکانی دونیا هەیە
فەرامۆشم دەکردن و
تەنها دەمگماند

زمانیان ئاڵقە تێ دەکردم
زمانی کەنارییەکیان لە دەمم دەخست






زمانیان زنجیر تێ دەخستم
زمانی کوندێکیان لە دەمی دەخستم
زمانیان قفڵ تێ دەکردم
زمانی شەمشەکوێرەکیان
لە دەمی دەخستم
زمانیان بزمار ڕێژ دەکردم
زمانی توتییەکیان لە دەم دەخستم
زمانیان هەسان لێ دەخشاندم
زمانی بولبولێکیان لەدەم دەخستم
زمانیان هەوسار تێ دەکردم
زمانی مەلێکی بێ بنەچەکەیان
لە دەمی دەخستم
زمانیان زێڕکفت دەکردم
زمانیان لە شووشە دەگرتم
زمانیان لە هەموو شتێک دەخشاندم
تا ڕەگەکانیان دەڕزین و
زمانیان بۆ پێش دەمی کسۆکەکان
هەڵدەهاویشتم
تا بێ زمانانە
بە هەموو جۆرە زمانێک
بە نێو ژیان دەکەوتم
کە تەنیایی لێم وەژوورێ دەکەوت
توند توند باوەشم
لە خۆم وەردێنا

وەکو ڕەنوو
نەرم نەرم دەکەوتم
هەندێ جار لەسەر هەرچی
هێلکە هەیە کورکیان دەکردم
هێلکەی هەموو تیرەکانی
کۆتریان وەبەر دەنام
لەسەر هێلکەی کوندەپوپویان
کورکیان دەکردم
لەسەر هێلکەی ماکەوان وەردەکەوتم
باڵم بەسەر هێلکەی سوێسکاندا
دادەکێشا
یا هێلکەی هەموو مێینەی مەلانیان
تێکەڵ دەکردن و وەبەریان دەنام
تا نەرم نەرم بە کورکی
چاوەکانم لەسەر یەک ڕۆ دەنا

***

وارێزەیەک دایدەپۆشیم و
سێوە ترشەی دە پایزانم و
ترێ کێویلکەکانم با دەیوەراندن
وەرین وەرین لە خۆم دادەوەرام
زۆر جاری دی هەوساریان دەدامە دەست
وردەواڵە فرۆشێک
هەموو ئاوێنە و مێخەک و
مورووەکانی خۆی پێوە دەکردم



یا هەوساریان دەدامە دەست
بۆیاغچییەک پەڕ پەڕ
پەڕەکانی بۆیە دەکردم
یا سیاسەتمەدارێک ڕایەڵ ڕایەڵی
دەمارەکانمی بژار دەکردم
یا نانەوایەک نانی گەرم
گەرمی لێ دروست دەکردم
یا زێرینگرێک جۆرەها زەخرەفەی
لەسەر ڕووم دەنەخشاند و
جەنگاوەرێک لەبەرەی جەنگ
قوم قوم نۆشی دەکردم
سیحربازێک جۆرەها قوڕی تێهەڵدەسووم و
سەدان شەیتانی تێدا دروست دەکردم
یا زانایەک کێهە ڕستەم جوانە دەینووسییەوە
دەنا جەستەی پڕ لە کاغەزی
دڕاو و سوتووی جغارەکەی دەکردم

***

مووە سپییەکانی پرچم هەڵدەکەند و
شیلانم لە جێ دەڕواندن
ئەو کراسەی لە ترێ ئاویلکە چنیبووم
لە بەرم دەکرد و
بەنێو هەموو تامەکانی دونیا دەکەوتم

***

زۆر جاران... پڕ پڕ لە کوندەپەپۆیان دەکردم

شەمشەکوێرە تێمدا فڕە فڕ و
چۆلەوانی غەرقی خۆی دەکردم
هەموو خانەکانم وێران وێران و
دوکەڵێکی خەست دایدەگرتم
درەختەکان گەڵایەکانیان لێ بەردەبوونەوە و
منیش عاشقەکان
گەڵایەکان دەوەرین و
پیاوەکان دەوەرین و
جغارەیەکی دیم دادەگیرساند و
تۆم دەکێشا...
درەختەکان لێوەکانی منیان دەمژین و
منیش لێوی هەنار و گەڵاو سێوەکانیان
کراسێکی لەو سێوە سوورانە لەبەر دەکردو
بەنێو هەموو تێکوەرانەکانی
دونیا دەکەوتم
ماسییەکان تێک دەوەران و
من لە تۆ دەوەرام
بە نێو ئەو تێکەوەرانانەی
لە سەهۆڵ ساردتر بوون
پڕوشەیان دەکرد و
بە نێو ئەو تێکئاڵانانە گەرمانەی
خەلووزێکی ڕەشیان لە پاش بەجێ دەما...
بە نێو ئەو تێکئاڵانانەی ژەهرێکی تفت
لە پاشیان بە جێما مابوو...





که هەناسەی کۆخەکانم هەڵدەمژی...
تامێکی خۆش لە نێو هەموو
دەمارەکانی لەشم دەگەڕا
بە جۆرەها ڕەنگ
لە سەربەخۆییم وەژوور دەکەوتن...
بەنێو سەرای ئەو کیژۆڵانەدا دەڕۆیشتم
لە سەربەخۆییبیان وەژوور دەکەوتم
سەرم لە بەر ئاڵاکانیان ڕۆ دەکرد و
دەمدیت
یەکێکیان هەڵتروشکابوو
هەردوو دەستی لە ناو دامێنی خۆی نابوو
واوەتر یەکی دی
داوێنی وشک هەڵاتبوو
جاڵجاڵۆکە جاویان بەسەر
داوێنیدا ڕاهێشتبوو
واوەتر یەکی دی عەورەتی خۆی
قوڕ دابوو
سەرووش یەکی دی بە چیچکانەوە
داوێنی وەبەر چەکوچان دابوو...
خوارووی تریش یەکیان پەپوولەکان لەسەر
داوێنی وشک هەڵاتبوو
ماسییەکانیش خنکابوون
خوارتر کەنیشکێک قوڕقوشمی
لە داوێنی خۆی دابوو



ژنێک منداڵدانی بە دەستەوە بوو
گڕی تێبەردابوو
ژنێکی دی
پڕ بە مشتی هێلکەکانی دەرهێنابوو
هەموو وردە دەمارەکانی هەستی دەرکێشابوو
کەنیلەیەکی دی هەموو ئاوەکانی
چۆڕەبڕ و شیری لە گیانی دایدۆشابوو
کیژێکی دی لەولاوە ڕەحمی
دەرکێشابوو بە بەردای هاڕیبوو

***

مێخۆش مێخۆش
لێوی هەنارەکانم هەڵدەمژین
ڕەنگیان لە بن پێستم دەگەڕا
لە پڕ هەر شەوەی لە نوێن و
لە باخەڵی پیاوێکدا دەیاننواندم
هەر شەوەی پیاوێکیان لە باوەش و
لە نێو جێگەکەیدا دەنواندم
زۆر شەوان دەیانخستمە نوێنی
شاهانشایەک و
ئاوریشمیان تێوەراندم
زۆر شەوی دی
دەیانبردمە نێو باوەشی
جەنەڕاڵێک و
بە شەڕاب دەیانخوساندم

یان دەیان بردمە نێو نوێنی
ئەو پیاوە ماقووڵ و ناودارانەی
بۆنخنکی ڕەبەنییان پێدا دەڕژاندم
یا دەیاندامە ئەو سەرسوپایەی
لەسەر قامچییەکان دەیخەواندم
یا دەیان بردم بۆ ئەو شۆڕشگێڕەی
لەسەر دروشمەکانی ڕایدەکشاندم
یا دەیاندامە ئەو ئاغا و کوێخا و شوانانەی
لە تەویلە و کادێن و
دیوەخانان وەریان دەکەواندم
یا دەیانبردمە نێو نوێنی
ئەو شێخ و مەلاو خەتیبانەی
لە مزگەوت و لەسەر بەرماڵ و
لە نێو پەڕپەڕی قورئانەکانیان دا
وەریان دەکەواندم
یان دەیانخستمە نوێنی ئەو سەرکردانەی
لەسەر هەر سنوورێک
لەسەر هەر کاغەزێک
لەسەر هەر چیایەک
لەسەر هەر مێزێک
لەنێو هەر جانتایەک
لە نێو هەر خەزنەیەک بووایە
وەریان دەکەواندم
دەیانخستمە نوێنی ئەو



سیاسییە بلیمەتانەی لە نێو باڕوتی
هەرگوللەیەک
لەنێو قەباغی هەر مینێک
لە نێو لوولەی هەر تۆپێک
لە نێو زەهری هەر گازێک
وەریان دەکەواندم
دەیانگەوزاندم... دەیانخەواندم

***

شەوێک لە شەوەکانی تەمەن نەنووستم و
بە تاریکی لە نێو شەوەکانی
عومرم دا ونیان کردم
شەوێک فلّچەیان لە خوێنم وەردەداو
شەوی خۆیان پێ سوور دەکرد
شەوێک فلّچەیان لە دلّم وەردەدا و
شەویان پێ ئەرخەوانی دەکرد
فلّچەیان لە جەرگم وەردەدا و
شەویان پێ شەڕابی دەکرد
فلّچەیان لەنێو چاوەکانم وەردەدا و
شەوەکانیان پێ تاریک و ڕەش دەکرد
فلّچەیان لە لێوەکانم وەردەدا و
شەویان پێ زەرد و کپ دەکرد
شەوێکی دی
فلّچەیان لە سینگم وەردەدا و
شەویان پێ بێ جووڵە و هەناسە دەکرد

فلّچەیان لە داوێنم وەردەداو
شەویان پێ بێ ڕەنگ دەکرد
نا فلّچەیان لە ڕۆحم وەردەدا و
شەویان بە تەواوی
پێ بێ ڕۆژ دەکرد

ئەو کراسە لە پرتەقالّەم لەبەر دەکردو
نارنجی نارنجی دادەگیرسام
توێکلّ توێکلّ لێیان دادەکاندم
قاش قاش لێیان دەکردمەوە و
تا بەو ڕووتییەوە
ڕووتییم بەدونیا وەردەکرد

چ نەدەما بەخۆیەوە نەگرم
پەلک... گولّ... گیا... چیلکە
پووش و پەلاّش هەر دانەدەپۆشرام
چ نەدەما بەخۆم دانەدەم
تۆپە قوماش... تۆپە نایلۆن
پەڕەی کاغەز... مافوور و
قالّی چادر و... تاولّ، بەرگی کتێبان
پێستی ئاژەلاّن
هەر پتر ڕووت دەبوومەوە... پتر ڕووت دەبوومەوە
با هەموو شتێکی لێ دەبردم
چم پێوە ڕانەدەوەستا تا



پەڕەکانم لەبنڕا هەلّدەکەندران
تووکەکانم کەولّ دەکرا
پێستەکانم دادەمالّدران
دەمارەکانم چۆن خوێنیان
تێدا دەجولاّ
ئێسقانەکانم چۆن بەیەکەوە
نووسابوون
بڕبڕەکانی پشتم چۆن پێکەوە
لکابوون
خانەکانی مێشکم چۆن
چنرابوون دەمدیتن
گۆشتم ڕەش ڕەش داگەڕاو و
دەمارەکانم هەر یەکێکیان
ڕەنگێکیان خوێن تێدابوو
خوێنیان تێدا مەیی بوو
بڕبڕەکانم بە خواری
لەسەر یەک دانرابوون
ئێسقانەکانم بەیەکدییەوە نووسابوو
خانەکانی مێشکم
بەو حالاّنەش لە عەشق نەدەکەوتم
***
دەمی وابوو چاوەکانم دەڕشتن و
قەبیلەیەک ژن
لەسەر پشتم کلیان دەچاوان دەکێشا



Photo Faris Saadi



چاوەکانم بە ڕەنگی شەو دەڕشتن
بەنێو هەموو شەوەکانی
عومرم دەکەوتن
چاوەکانم بە ڕەژوو دەڕشتن
بەنێو هەموو پشکۆیەک دەکەوتم
ڕەنگم ئاگری دادەگیرسا
چاوەکانم بە ڕەنگی ژن دەڕشتن
بەنێو گەرمیی ژن دەکەوتم
هەزارەها هەزار
ژنم تێدا هەڵدایسا
چاوەکانم تۆخ... تۆخ
بە سورمەی گوڵان دەکێشا
ئێلێک ژن بە نەشوەوە
لە چاوانم دەگەڕان
لە چاوانم هەڵدەڕژان
چاوەکانم بە زەردەپەڕی دەڕشتن
سەرابێکی خەست خەست
لە چاوانم دەگەڕا

***

بە کتوپڕی بەنێو پەیکەرەکانی
خۆمدا ڕادەبووم
لە پەیکەرێکم دا
غوبارێکی چڕ دایپۆشیبووم
لە پەیکەرێکی دیدا

چاوەکانم فرمێسکیان لەبەر دەڕۆیی
لەتەنیشت ویش سەرم
لەنێو ئەژنۆیەکانم گرتبوو
پەیکەرێکی بەخۆوەترمیان
هەموو ئاوێنەبەند کردبوو
ئەوی بەرەو ژوورترمیان
لەبەردێکی ئەستەمیان داتاشیبوو
هەندێکی دییان لە داری
گوێز و لە داری چنار داتاشرابوون
لەوێ واوەتر زەرد زەرد دەچوومەوە
هەموو شتێکم کرابۆوە
تەنها چاوەکانم نەبێ
هەموو شتێکم هەڵێنابوو
تەنیا چاوەکانم نەبێ
لەوێ واوەتر لە ڕەژوو
پەیکەرێکیان بۆ داتاشیبووم
هەردوو دەستم هەڵێنابوو
داوێنم سینگم وەدەر کەوتبوو
لەیەکێ دیاندا توشیییەکی
سەیر تێمدا هەڵی کردبوو
دەستەکانم لەسەهۆڵ و
ڕانەکانم لە تەرزەدا
داپۆشرابووم
لەولاتر سەریان بە بەدەنی



جانەوەرێکەوە نووساندبووم
لە پشت وی لەشی باڵندەیەکیان
بەسەریەوە لکاندبووم
کە وەر دەسووڕامەوە دەستەکانمیان
بە قاڵبی پڵینگێکەوە نابوو
بەسەر چنگان چاوی پشیلەیەکیان
لە قوڵتی چاوان نابووم
یا سەریان بە لەشی تاووسێکەوە
نووساندبووم
یا ڕانەکانی جاشکێکیان
پێوە لکاندبووم
تا سەرم لە جەستەیەک هەڵدەقەندەوە
لەشم لێ بەردەبۆوە یا
دەستەکانم لێ دەکردنەوە
دەمویست بەیەکیانەوە بنێمەوە
قاچەکانم لێ ون دەبوونەوە
نەمدەزانی چۆنا و چۆنی
خۆم لەسەر یەک ڕۆنێمەوە...

***

لەسەرەخۆ زەردەپەڕم
لەپرچەکانم هەڵدەسوو
زەردەپەڕم لە خۆ وەردەپێچاو...
ڕادەمامم لەخۆ
ڕەنگم دەگۆڕا

هەر دەم نا دەم ڕەنگێکم دەگرت
دەمێک بە ڕەنگێکی
ئاسمانیی تۆخ دادەگەڕام
دەمێکی تر وەکی
دەریایەکی شین دادەگیرسام
دەمێکی دی درەختییەکی تاریک و
دەمێکی دیش وەکی زەوی
دەمێکی دی قاوەییەکی چیایی و
نێرگزیانە دادەگیرسام
دەمێکی دی شەڕابی و
تا تەواو بە ڕەنگی تۆ دەگەڕام

***

کراسێکی لەو هەنارە ترشانەم دەپۆشی
هەنارانە دادەگیرام
زۆرجاران پڕ پڕیان دەکردم
لە ژنی ئاوس
لەو ژنانەی لە دەمانچەیەک
ئاوس ببوون
لەو ژنانەی لە تیرەی گورگێک
منداڵیان وەزگی کەوتبوو
لەو ژنانەی لە جانەوەران
تۆڵیان پڕببوو
لەو ژنانەی لەزەتیان دەگەڵ
ئەژدیهایەک کردبوو





لە پڕ تێکرا دەزان
پڕیان دەکردم لە هاوار و قریشکە و
ناڵەیان تێمدا دەهات و دەچوو
منداڵێکیان لەبری گریە
گیزە گیزی گوللە لە هەوکی دەهاتە دەرێ
یەکی دیان لە بری گریە دەیحەپاند و
ئەوی دی دەفیشکاند و
یەکی دیان دەیقروسکاند
لە پڕ وەشەپۆل دەکەوتم
شەپۆلی ورد ورد
شەپۆلی خێرا خێرا
شەپۆلی نەرم نەرم
هەموو دونیام بەشەپۆل دەگێڕا

کراسێکی شەرەف و
لەچکێکی ناموسم لە خۆ وەردەپێچا و
بە نێو پاکی دەکەوتم
دەبوومە سەحرایێکی بەرین بەرین
وشکانیم لێ دەتکا
خۆڵم لێ دەباری
چۆڵەوانیم لێ دەپرینگایەوە
تەنهاییم تێدا دەزرینگایەوە
یا سەحرام دەڕۆحی
هەموو پیاواندا دروست دەکرد



تا زەرد زەرد دەبوومە غوبار و
دەنیشتمە سەر هەموو شتێک
یا پڕ پڕ دەبووم لە بۆشایی
دەچوومە نێو بۆشایی هەر پیاوێک
هەر گوڵێک، هەر منداڵێک و
دەپشکوتم هەموو جوانیم لە خۆدا دەپشکواند
خۆم کەسک دەکرد
کەسک... کەسک
خۆمم تەڕ دەکرد
تەڕ... تەڕ
خۆم سوور دەکرد
خۆم دەباراند
خۆم هەڵدەکرد و
هەر بۆنی پایزیم لە هەناوان دەهات
بۆنی پایزیی لە خوێنم دەهات
پایزانە دادەگەڕام
ئەنیتم ڕادەمووسی و ئەنیت ڕایدەمووسیم
گلێنەکانتم ڕادەمووسی... گلێنەکانمت ڕادەموسی
پەنجەکانتم ڕادەمووسی
پەنجەکانمت ڕادەمووسین
مێژوویەکی ون... پەنجەکانمی دەگوشین و
ڕەگی ماچی دەخستە خوێنمەوە
مێژوویەکی کوێر
پێڵوەکانی لە پێڵوم دەخشاندو






بینایی دەخستە چاوانمەوە
مێژوویەکی دزراو
سەرەتاتکەی دەگەڵ دەکردم و
نەخشەی دەیان ئیماراتی دەخستە نەخشەمەوە
هێڵێ چەندان سنووری دەخستە نەخشەکەمەوە
ڕوون ڕوون بەنێو دڵۆپەکانی
بارانێ دەکەوتم و
هەموو ژیانم تەڕ دەکرد
خەنجەریان لێ هەڵدەکێشام و
دەیانکوشتم
قەڵەمیان لێ هەڵدەکێشام و
دەیانکوشتم
زمانیان... چاویان... دەستیان
لێ هەڵدەکێشام و دەیان کوشتم
لە ناکاو دەملوراند... دەمفیشکاند
دەمقروسکاند... دەمخوێند
دەمحەپاند و بانگی خۆمم دەکرد
چرایەکم دادەگیرساند... شەوم دادەگیرساند
تەنیاییم دادەگیرساند و
گەمەم بەگوڵەکان دەکرد
لە کاکۆڵم وەردەدان... لە سینگم وەردەدان
بۆنم دەکردن... بەهەموو گیانی خۆم دادەکردن
سەرم لە بەر خۆ دەنا
چاوم لە بەر خۆ دەنا

ڕۆحم لە بەر خۆ دەنا
دەستم لەبەر خۆ دەنان و
تا هەموو گیانم دەبۆ (سەرو هار)
دادەمام
نەخشەکانی خۆمم هەموو دەشێواندن
سنوورەکانم تێک دەشکاندن
ئەو ژن بوونەم لە خۆ دادەڕنی و
دەمێک گوڵ و، دەمێک ماچ و
دەمێک بارانم دەباراند
زۆر دەمێ دی دەبوومە
سارا نشینێکێ تەواو
هەموو گیانم بە سارادا دەگەڕا و
لە تەنهاییيان وشک هەڵدەگەڕام
سەرم لەنێو ئەژنۆیان دەگرت
وەسەرخۆ دەکەوتم و
خۆمم دادەتاشی
لە قوڕ... لە بەرد... لە گوڵ
لە ڕەژوو... لە ئاو... لە پیاو
لە ئاگر...لە شەو... لە هەور

***

بە جوانترین نەشوەوە بروسکەم دەپۆشی
بروسکەم لە پرچەکانم هەڵدەسوو
بروسکەم لە خۆ وەردەپێچا
بروسکەم لە مل دەکرد



بروسکەم لە چاوان دەکێشا
بەنێو هەموو بروسکەیەک دەکەوتم
پرچەکانی خۆم شە دەکردن
شوڵی درەختەکانم شە دەکردن
یاڵی ئەسپەکانم شە دەکردن... تا
هەموو وێکڕا ژیوار دەبووین
هەموو تەمەنم کاوێژ دەکرد
کاوێژی پاکی... کاوێژی نان
کاوێژی ژان... کاوێژی تێک ئاڵان
کاوێژی ژن... کاوێژی خوێن
کاوێژی خاک... کاوێژی عەشقم دەکردەوە

بۆنی قەمچی لە خوێنم دەهات
بۆنی قەمچی لە پرچەکانم دەهات
بۆنی قەمچی لە تیغارەی پشتم و
لە ترپە ترپەکانی دڵمەوە دەهات
تا قەمچییان پێ دەپەرستم
قەمچییان پێ ماچ دەکردم
هەر دەگەڵ قەمچی لەزەت و
سەدان منداڵی لە قەمچییم
وەزگی دەکەوتن...
تا تامی قەمچی لە بارانکانمەوە دەهات
تامی قەمچی لە سێوەکانمەوە دەهات
تامی قەمچی لە شیرمەوە دەهات






دەمارەکانم ئەو ڕەنگەیان تێ دەزا

***

چ غەوارەیەکی تەنهاو پایزپۆش بووم
پایز بەپروشە پروش گەڵای لێ دادەباراندم
دەریا لێڵ لێڵ گێژەی تێدا دەخولڤاندم
بەفر شلێوە شلێوە مەلەکانی دەتۆراندم... تا
ئولفەتم بە ڕام بوون دەگرت...
ئولفەتم بەکپیی دەگرت...
ئولفەتم بەسەر لەبەر خۆنانەوە دەگرت
بە تێریی بە برسییەتی... بە مەندی بەهاری
بەکەحێڵیی... بەبێ ڕێشمی
بەڕەهایی... بە دیلیی
بەئیمانداری... بە پاکیزەیی
بەئەفسانە... بە خەیاڵ
بەپیاوەتی... بە ژنیەی و
تا ئولفەتم بە خۆمەوە دەگرت
هەوری تەڕ تەڕم دەپۆشین و
دڵۆپەکانی بارانییم لە گەردنی دەکردن
خوم بەداسەپاندنی وەدەگرت
خوم بەشەڕ... خوم بەخۆرانانی وەدەگرت

لە پڕ منداڵیتیم لە خۆ هەڵدەسوویەوە
دەگەڵ هەورە پەپوولە دەکەوتم
سیاسەتم لەخۆ هەڵدەسوو

دەگەڵ سەگەکان دەکەوتم
درۆم لەخۆم هەڵدەسوو
دەگەڵ ئیماندارەکان دەکەوتم
بێ ویژدانیم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ پیاوەکان دەکەوتم
خیانەتم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ شۆڕشگێڕەکان دەکەوتم
دارِمانم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ ڕۆشنبیرەکان دەکەوتم
نەوتم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ ئیستیعمارەکان دەکەوتم
کتێبخانەکانم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ زانایەکان دەکەوتم
ژەهرم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ حەکیمەکان دەکەوتم
ڕم و شمشێر و گوللەم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ دەسەڵاتداران دەکەوتم
ترس وشەرم و شەرەفم لەخۆ هەڵدەسوو
دەگەڵ حورمەکان دەکەوتم
چەفیە و خشڵ و مێیەتیم لەخۆ هەڵدەسوو
بەنێو خاتتونەکان دەکەوتم
بڕانەوە و خەفەبوون و پەککەوتەییم دەپۆشی و
بەنێو داوێنی کەنیلەکان دەکەوتم



ئەو جار شەرای ئاگرم دەپۆشی... بەنێو کولوی بەفر و
کولوی گوڵ و کولووەکانی ژن دەکەوتم
گومان و ناڵە و گریە و سڵەمینەوەم لەخۆ هەڵدەسوو
بەو دیوی یەکە یەکە پەردەکانی خۆم دەکەوتم

***

بەشەرای ئاگر چاوەکانم دەڕشتن
شەرای ئاگرم لەبەر دەکرد
زوڵفەکانم بەشەرای ئاگر شە دەکردن
بە نێو پریشکەکانی خۆر دەکەوتم
دەگەڵ هەموو تیرەکانی کۆتر هەڵدەفڕیم
باڵە فڕێم دەکرد
دەگەڵ هەموو ماکۆترەکان
شەمەند شەمەند
سەرحەدەکانی تۆم تەی دەکرد و
ڕەوم دەکرد
دەگەڵ پەپوولە سلێمانکەوە
دار کوونکەرە و قاژوو
سوێسکە و کەو و پۆڕ و
شەمشەمە کوێرە و قولنگ و... تیترواسک و
دەریاچە دەریاچە... زۆنگاو زۆنگاو
لە چڕوپڕترین جەنگەڵ و بێشەڵاندا
هێلکەکانم بەجێ دەهێشتن
بێ سەجەرە و ڕەگەزنامە... بێ قەبزە و قەواڵە
هەر دەمەێ دەگەڵ تیرەیەکیان

هەموو ڕۆژەکانی عومرم بەرێدەکردن
سپێدان زوو زوو... چی ئۆقیانووس و
زەریا و دەریا و
دەریاچە و ڕووبارەکانی دونیام دەپۆشین و
بە شینێکی تۆخ تۆخ دادەگەڕام
پڕ دەبووم لە کەشتی و لە
گەمی و لە کەڵەک و لە بەلەم و
ڕەبەن ڕەبەن... لەسەر گەمی ڕۆحم
بە پەنجەکانت سەوڵت لێ دەدام
لە پشت چرایەکانمەوە

***

هێندە لە خۆ بە ئاگایان ڕادەهێنام...
تا لە پڕ جەستەم لێ دەدزرا
هەر لە نێو خۆمدا هەزاران
جار جەستەم تالآن دەکرا
جەستەم لێ ون دەبوو
هەر خۆم لە نێو خۆم
ڕۆژی سەد جار لە خۆم دەگەڕام
جەستەم بەش بەش دەکرا
لە هەر جێیەم
کەوشەن کەوشەن دیاری دەکرا
جەستەم لێ دەگۆڕدرا
هەر جەستەیەم بۆنێک و
هەر جەستەیەم ڕەنگێک و



هەر جەستەیەم خوێنێکی تێ دەزا
جەستەم لێ بەجێ دەما
لە هەر جێیەکی شوینەوارێک و
مێژوویەک و...
خاک و خۆڵێک... سێدارەیەک
زیندانی دێرین دێرین بەجێ دەما
جەستەم جۆرەها عورفی تێدا دەچەسپا
شەرع و... شیربایی و مارەیی
سەرنەخت و... ئایین سەربەسەر و
گەورە بەگچکە و
لە جەستەیەکم حەڵاڵی و
لە جەستەیەکمدا شوورەی بەرین بەرین و
هەزارەها هێلانەی کوندەپەپۆ تێدا بەجێ دەما

هێشوو هێشوو... هێشووەکانم دەگەیین و
دەبوومە شەڕاب
لە گلێنەی چاوەکانم دا
شەڕابێکی توند دەهات و دەچوو
لە نێو توێی لێوەکانمدا
شەڕابێکی خەست خەست
خۆش دەبوو
تا شەڕابی شەڕابی دایسام و
شەڕاب بەنێو هەموو
مەلولە و دەزوولەکانم وەردەبوو






دەریایەکی ڕوون ڕوون
ماسییەکان گەرایان لە نێو
کون و کەلەبەرەکانمدا بەجێ دەهێشت
نەهەنگەکان گەرایان
لەسەر جێ دەهێشتم
مێش و کرمەکان
گەرایان لەسەر دەکردم
سەراویلکە و قاسنە و
کەفی دەریایەکان... گەرایان لەسەر جێ دەهێشتم
تا دەبوومە مەملەکەتێکی
پڕ پڕ لە گەرا
ملیۆنەها ملیۆن پەپوولەم تێدا دەترووکان
هەر لە ژوور ڕا
بە نێو زیندانەکانی خۆمدا دەهاتم...
زیندانی نوێ نوێ
زیندانی دێرین دێرین
زیندانی قووڵ... تاریک
زیندانی قەرەباڵغ و تاکەکەسی
زیندانی شێدار... زیندانی لە ئاسن
زیندانی پڕ لە گوڵ
زیندانی بێ شوورە و شیشە
خۆم دەدیت
لە هەر گرتووخانەیەکدا
لە سەر تاوانێک حوکم درا بووم

له زیندانێکدا... لەسەر کوشتنی خۆم
له زیندانێکی تردا... لەسەر دزینی خۆم
له یەکی دیدا لەسەر ئاوردانی خۆم
له دیوێکی دێدا لەسەر
شکار و بێ سەروشوێن کردنی خۆم
له زیندانێکی تردا لەسەر
دروستکردنەوەی کلیل لەسەر
هەموو کلیلەکانی خۆم
لەولاتریش
له سەر بە غەش کردنی
رەگەزنامە و ناسنامەکانی خۆم
تا ببوومە گەورەترین زیندان و
پڕ پڕ ببووم له دیلەکانی خۆم
شەرا ژنێک
هەموو شتێک له بۆم دەبۆ (سەرۆ)
دەبوومە سەرۆی هەموو شتێک
پرتەقالآنە نەختە نەختە
بە نارنجیدا دەگەڕام و
بە درەختەکانەوە دادەگیرسام
له خرم و هوری قەلآدە و زنجیر و
خەناوکەکانی گەردەنم
ڕادەچەنیم و خۆم نەدەدیبیەوە
له خرینگە خرینگی پاوانە و سندم و
کۆتەکانی بەلەکم ڕادەچڵەکیم و



خۆم نەدەناسییەوە
کراسێکی له شەپۆلم دەپۆشی و
بەشەپۆل چاوم دەڕشتن
شەپۆلم له خۆم هەڵدەکێشا و
مەند مەند بە نێو شەپۆلەکان دەکەوتم

له پڕ دەهاتن و دەستیان بەسەریدا
دەهێنام و له مێژووم دەبوونە وەکیل
له ئەڤینم دەبوونە وەکیل
له نیشتمان پەروەرییم دەبوونە وەکیل
له شۆڕشەکانم... له ڕەوم... له خاکەکانم
له ویژدانم
له بینینم له سنوورەکانم دەبوونە وەکیل
له ڕەگەز و له ناو و له مردنم دەبوونە وەکیل
له ڕتووشی گوناه و
له پاکیزەیی و له ئیمانم
له ڕەسمکردنی بچووکترین ماک و
خەت لەسەر نەخشەکانم
دەبوونە وەکیل
له مۆرکردنی هەموو قەبزە و
قەواڵ ەو ناسنامەی وەفاتەکانم

چۆراوکەی عەشقم لەبەر دەڕۆیی
له تاوان هەموو وێنەکانی





منداڵیم گەورە دەکردن و
ڕێبەدییم دەکرد منداڵ ببمەوە
منداڵ نەدەبوومەوە
مووەکانم شە نەدەکردن
پێڵاوەکانم لە پێ نەدەکردن
منداڵ نەدەبوومەوە...
هەنیسک لە دووی هەنیسک
بەسەر دونیادا دەگریام و
منداڵ نەدەبوومەوە
دەستم لە چی پیسیی و قەدەغەیی و
خەتەرەکان هەیە وەردەدا و
منداڵ نەدەبوومەوە...
غار غار بە دووی هەورە بەپوولەکان دا
غارم دەدا و
شەوان ئەستێرە ئەستێرەم
دەژمارد و...
نینۆک... نینۆکی
خۆم گەز لێ دەگرت
ورکی درێژ درێژم دەگرت...
هەموو دونیام لە کۆشی خۆم
دەکرد و ژیر نەدەبوومەوە
شەقم لە تۆپ تۆپی
ئەو کەونە هەڵ دەدا
بووکەڵە لە دووی بووکەڵەم

جوان دەکردن و
بەرد لە دووی بەردم دەگرتە
هەموو دەرگا و دیوارەکانی دونیا
یارییەکان فێر نەدەبوومەوە
شاری مێرووەکانم پێک وەردەکرن
فەرخە چۆلەکەی نێو
گوێ سواندەکانم دەردەهێنان و
گوڵەکانم هەڵدەپرووکاندن و
هەنارەکانم دەوەراندن و
ساویلکە نەدەبوومەوە

چی ڕەنگ و بەرگ و نازناو و
گوناه و... جلکە لەخۆم دادەماڵین و
ڕووت نەدەبوومەوە
تا تریفەی مانگم
لە چاوەکانم دەخشاند
تریفەی مانگم بەخۆم دادەدا
تریفەی مانگم لە پەنجەکانم هەڵدەکێشا
لەگەڵ مەندیی شەو مەند دەبووم
تریفەییانە
سەر خەوێکم دەشکاند و
گەورەیان دەکردم
جۆرەها کراسی شۆڕبووەوە و
بەر موورەی درێژ – درێژ و



بەرگی قەبە و ئەستووریان
لەبەر دەکردم
جۆرەها کەوش و قۆندەرەی...
پانییە داریان لەپێ دەکردم

منداڵیەتیم چۆڕچۆڕ لێ هەڵدەڕژا
لە ڕۆحمدا چی ڕەگی خیانەت و
درۆ و دوو ڕوویی و بێ ویژدانی هەبوو...
قووڵ قووڵ دەیانچاندن
منداڵییم تنۆک تنۆک لێ دەتکا

***

چی ئۆین وتەڵە هەیە لە جەستەم دا
دەیان بزواندن
چی قەهر و بوغز و خۆپەرستێ هەیە
لەسەر دیوارەکانی ڕۆحیان هەڵدەکەناندم
چی گومان و زوڵم و خەتا هەیە
لە نێوە ڕاستی دڵیان دا
پێ بەحەشاردان دەدام
منداڵییەتیم...
دڵۆپ... دڵۆپ لێ دەباری

***

هومایەکی قشت قشت بووم
نەرم نەرم دەنیشتمەوە و... دەفڕیم
مشتم لە کانیاو و سەرچاوە و

تاڤگەکانی خۆ هەڵدەدا و
دەمخواردنەوە
وەکو تەم بەسەر هەموو
تەنهایی و غەوارەیی و
چۆڵەوانییەکانی خۆم
دەنیشتم و
دەستم لەناو پرچەکانم وەردەدا و
کەونم تێک با هەڵدەدا
بێ بنەچەکەو
بێ ڕەچەڵەک و بێ پشت
شوورەکانی خۆم تێک دەشکاندن و
دەفڕیم...

***